شیعر




# MOUNTAIN,
# EXILE AND
# LAMENTATION

KURDISH POEMS

BY

JAFFER SHEYHOLISLAMI

Canada 1991

# چیاو

# کۆچ و

# چەمەر

جەعفەری شێخولیسلامی
(ئاشتی)

١٩٩١

بۆ:

**ئەوین** و

هیوای بە یەکتر گەیشتنەوە.

**هەڵۆ** و

هەڵفڕینی بێ نیشتنەوە.

# هه ستی ناکام

گەلێ جێگای سەرنجی
لێرەواری خەندەلێو!
بۆ منی بەندیی ڕێبوار
لێرەوار و بەندەن پێو

گەرنی تەرزت داپۆشراو
وەک لووتکەی بەرزی چیا
لە بناری سەر هەڵدەدەن
جووتەڵێک کارگی ساوا

ئەو لۆیەی بسکی ڕەشت
لە هەوری دەرپەڕیوە
لە ڕەزچنین، ئارەقەی
سەر کوڵمەتی سڕیوە؛

ڕادەکێشێ مەلی دڵ
گەرچی دیارە بە داوە
بەڵام، کوا مەلی برسی
گوێی لە بەند و لە داوە

دەمێکە دوور لە خۆشیم
بێ دینی جوانی، جوانێ!
بۆیە چاوم بڕیوە
لە جوانی بەر هەیوانێ

تۆ بۆچ ئاوا دەڕوانی
لە دیمەنی شێواوم؟
نیگات دڵداری نییە
پێشتر گەلێ پێکاوم

ژیاوی ئازاد بێ بەندەک
لەم کەژ و لێڕ و شیوە
لۆمەی ڕوانینت ناکەم
هێشتا بەندیت نەدیوە

خۆزگە دەمتوانی تاوێ
لەبەر دەمت ڕاوەستم
دەربڕم کوڵی دڵم
ئەو هەستەی کە پێی پەستم

بزانی: منیش ڕۆژێ
تامی ژوانم چێشتوە
لە بن دیوار و پاردە
زۆر یادی خۆشم ناشتوە



ماندوویی ڕۆژی هاوین
ئاوداشتن و دەسکەنە
هەمووم لە لەش دەرکردوون
بە ماچێکی بەرچەنە

ئەم لەشەی وا دەیبینی
ئێستا لە نێو بەرگی شڕ
زۆر چیمەنی شێلاوە
لە تەک لەشی نەرم و پڕ

ئەم دەستەی لە بەر چاوت
سڕ و بێ هەست و تینە
ڕۆژێ بای ڕەحمەت بووە
بۆ لیمۆی باغی سینە

ئەم لێوەی کە دەیبینی
وشک و بەبار و زەردە
وەک زەروو خاڵی مشتوە
لەو گەردنەی بێ گەردە

جوانێ بێدڵی کردووم
بە مۆنە و جوێن و مەکەی
پێیانی لە بەند بردووم
نیگای بە دزی ژێر پەچەی

بە ڕۆژ کێشانی پەردە
بەری چاوی ڕەش کردووم
بەشەو نیسیێی پشت پەردە
ئاوری دڵی گەش کردووم

حەیفە نەزانی: بۆچی
تووشی ئەمڕۆژە هاتم
بە دڵێکی پڕ لە تاسە
بێ هێز و دەستەڵاتم

نەزانی دوور لەم دێیە
لە نێو شارو باژێڕان
زۆری لە برسان دەمرن
لە پاڵماڵی زگ تێڕان

کەلاوە و چۆلگەی دزێو
کاولاشی بێ ئەنواکان
بۆ خۆی ئاوەدان دەبێ
بە تەرمی بێ هاناکان

بینشکەی منالی زۆر شوێن
بە گرمەی تۆپ ڕادەژێ
لەجێی گوڵاو، بەسەر بووک
ئەسرینی خەم دەپرژێ



سێلاوی خوێن و کەف بێ
لە زۆر شوێنان لەم دێیە
بۆ پووڵ و سەرمایە و زێڕ
تاسەی زۆر مرۆڤ نوێیە

هەندێک کەس تەگبیر دەکەن
چۆن پێشی مردن بگرن
گەلێکیش تاسەدارن
زوو بگا ڕۆژی مردن

حەیفە نەزانی: ڕۆژێ
هەزارانی وەکوو من
بۆ هەزارانی وەک تۆ
لە باوەش دەگرن مردن،

نەک بۆ ماچێکی کوڵمەت
بۆو دەستەت دڕوو دەڕنێ
بەو هیوایە شل نابێ
ڕۆژێکی بێ گوڵ بچنێ...

بەندی دڵی زامدارمن
لە وانە دڵتەزێن‌تر
لە سەریان تووشی بەند بوون
لە من زۆر شەوبەزێن‌تر

خۆزگە دەکرا، ئەوەندە
لەبەر دەمت ڕاوەستم
هەندێکی لێ دەربڕم
لەو هەستەی کە پێی پەستم

بەلام داخی گرانم
بزوەی نەجوولێ جەستەم
چەند چاوی زیت دەڕوانن
بێ ئاکامە ئەو هەستەم

دێ جێ دێلم، ڕێ دەبڕم
مەنزڵ نامۆ و نادیار...
گەرچی دوورکەوتووم، دیارە
بزەی لێو، شۆخی نازدار!

بێتووش ــ پاییزی: ١٩٨٢-١٣٦١



# شارەکەی من

کووچەکانی شارەکەی من
چەشنی تابووتی هەتاون
تاسە بارن:
هەست بکەن پێی لاوی شەوگەڕ،
ئەو کەسانەی
وا بەتینی کاوی ژوان و ژینی بێ ژان
هەڵچزاون...

پەنجەرە، بێڕەنگ و بەستەن
بولبولی بێدەنگ و خەستەن،
تاسە بارن:
دەستی ئاسک
شەق بکا سینەی پڕی ڕازی لەمێژین؛
بای هەناسەی پڕ لە تاسەی
کزنە ڕێبواری هەرێمی بەختیاری
لا بدا تۆزی پەژارەی

بێ مرادی و چاوەڕوانی،
دیمەنی شێواوی ئەمشەو
دیمەنی جوانی بەیانی...

شارەکەی من، چاوەڕێیە
لێوبەباری چارەنووسی تێکەوێ ڕێی،
دەنگی گرمەی گەرمی ژێر پێی
ڕاپەڕینێ نازەنینێ،
خەونی ئاڵۆزی بشێوێنێ
تریقەی پێکەنینێ.

مەهاباد ـ پاییزی ١٩٨٣-١٣٦٢



# پۆلووی جودایی

ئەوین تواوە لە کڵپەو تینی دڵ، سەر شین نەکەم چبکەم؟
نیە کەس هەست بکا بۆسۆ و چرووک، گەر شین نەکەم چبکەم؟

کە کیژی خۆر بزر بوو، ئاسمان گریا پڕی دەریا
کە تۆ ڕۆیی هەموو دەریا بە کوڵ ئەسرین نەکەم چبکەم؟!

وەفاو پەیمان لە تۆ فێر بووم کەچی خۆت بێوەفا دەرچووی!
پەنا بۆ مەی ئەبەم، خۆم پەست و مەست و دین نەکەم چبکەم؟

هەزارن خورپە داوێنە دڵ و دڵ هەر لە شوێنێکە
لەسەر پۆلووی جوداییت توێنی دڵم چین چین نەکەم چبکەم؟

وەفا و مەی تا حەڵاڵ بوون شەوتەڕێن بوو مۆمی هیواکەم
کە دڵ شەم بێ، بەسەریا شێوەنی خوێنین نەکەم چبکەم؟

لە کوێ ویستی کە نێوانی من و تۆ هەڵبڕێ گەردوون
ستەمکردی، دڵم لێوڕێژی تۆڵەو قین نەکەم چبکەم؟

له عیشق ئەدوینم، بە کوڵ ئەگریم، دەڵێم ئاوێ وەئاگرکەم
خەیاڵ خاوە، کە تەرکی کاغەز و نووسین نەکەم چبکەم؟

مەهاباد ــ زستانی ١٩٨٣-١٣٦٢



## نەزری دڵ

دوێنشەو نەزەرێ نەزری گەرەک بوو لە منی پەست
پێ سست و نەزەر دیلی نەزەر مایەوە، سەرمەست

دڵ پێمی دەگووت: نەزری بکە گیان و سەر و ماڵ
دەم نەیبوو بڕست، ڕابوو دڵ، ئەو تێپەڕی بێ هەست

تاران ــ هاوینی ١٩٨٤-١٣٦٣

# هەر دێمەوە

ئەوینەکەم!
هەموو شەوێ لە دووروڵات،
مۆمی لەشم
بە بڵێسەی یادی تۆوە ئەتوێنمەوە.
بە ئارەزووی بینینەوەت
بێکەس و دەر
وەک مارانگاز ئەتلێمەوە.

کاتێ بینیت:
کزگە بەفری نێو کوچەتان
وردە وردە ئەتوێتەوە،
دارە پیرەی نێو حەوشەتان
ئارام ئارام ئەشنێتەوە،
دڵنیابە یادم کردووی
بە دەم ئاخ و هەناسەوە،
بە دەم هەزاران تاسەوە...

هەرکە دیتت:
قاز و قورینگ، قەتار قەتار
لە گەرمێن ڕا گەڕانەوە،
گوڵی سووری نێو باغچەتان
بە دەم شنەی نەرمی بەیان لەرانەوە،
دڵنیابە بەڕێمەوە،
چاوەڕێ بە
هەر دێمەوە، هەر دێمەوە.

* * * *

بێ‌شک لەسەر گونسوانەتان
گرمەی غەزەب، کۆترەکانی تاراندووە؛
کوندەبووی شووم
بە ئێسقانی منداڵەکان
هێلانەکەی خۆش کردووە...

سەد هێندەی‌تر
ڕێ تاریک بێ
هەڵدێر و ڕژد و باریک بێ
هەر دێمەوە!

من دێمەوە تا پێت بڵێم:



هەر منالی، کرچ و کالی
بیر لە مردن نەکەیتەوە.

* * * *

بەهارەکەم!
دارەکانی ئەم هەرێمەش
چرۆ و گوڵیان دەرکردووە؛
دەشت و پێدەشت، دۆڵ و چیا
بەرگی سەوزیان بەر کردووە؛
ئەمما، نایە
دەنگێکی تەڕ لە هیچ لایە
ـ جریوەیەک، تریقەیەک، شنەی بایە ـ
سرتە ڕازێکە بێ بنە...
ڕوانین پڕ ئاخاوتنە...

گوڵاڵەکەم!
کەسێ وەک من
کە پەروەردەی گاڵەی شەماڵ
سیراندن و قاسپاندنە،
باش دەزانێ:
بێ دەنگی جۆرێ مردنە.
بە پرشنگی چاوەڕوانیت
ڕێی تاریکم ڕووناک کەوە

با بینمەوە ،
تاکوو بەهار بە خەملیوی
لە چاوتدا ببینمەوە .

با بینمەوە
تا لەگەڵ تۆ ،

لەسەر بستووی هەوارگەی سوور
پڕ لە چنوور ،
لە بەستێنی چەمی خوڕێن
کانی بلوور ،
لەگەڵ ڕێژنەی ئاسۆگەی دوور ،
بە ئاهەنگی تاسە و ئەوین
شیعری ئومێد ،
سرودی ژین بخوێنمەوە .
چاوەڕێبە
دڵنیابە
هەر دێمەوە ، هەر دێمەوە ، هەر دێمەوە .

تاران_خاکەلێوەی ١٩٨٥-١٣٦٤



# نەمەکگیر

« چاوەکەم! ئەمڕۆ لەگوڵشەنی گوڵ بە عیشوە خۆی نوواند(١) »
با نەمەکگیربم، بە مەرگی تۆ قەسەم تێرم دووانـد

ونـدەچوو گەردی بەری پێت نیشتبێتە ڕوومەتی
سووچی خۆت بوو، چونکە شێوەی وێت دەچوو دڵمی ڕفانـد

شێتم و تاسەم بەزەی دەستی پەری‌ئاسایەکە
بێتەوە بیرم چلۆن بوو دەستی پەریانەت وەشاند

قەت نەبوو جارێ دڵم جوانێ ببینێ و ڕانەبێ
تۆی کە دیت هێزی نەبوو ڕابێ، بەجارێ خۆی مراند

پێ بڕاو و پەڕوەریوی داو و تۆڕ بووم و ڕەوەک
وا بە دندووک پێوە بووم پێم سەیرە داوت چۆن چەقاند!

چونکە سینەم کێوە، نینۆک تیشەیە لۆمەم دەکەن
کەس نیە لۆمەت بکا: بۆ هێندە شیرین خۆت نواند

چاوەنۆڕی ڕۆژی وەسڵت دەردی دووری سووک دەکا
هەستی شێواوی زەمانەماڵەکەی سەبری ڕماند

وا بە شوعلەی خەم وجاخت هەڵگڕاند تۆ ئەی (حەریق)!
من بە شوعلەی تۆ حەریقم، بۆیە شوێنی تۆم شکاند ‹٢›

تاران ـ هاوینی ١٩٨٥-١٩٦٤

‹١› تاکە میسرەعێکی (حەریق)ە.

‹٢› حەریق: تۆ بە شوعلەی خەم حەریقی وا وجاخت هەڵگڕاند.



## دەردی دڵ

کێ دەزانێ چ لە نێو ئەم دڵە دا ڕادەبرێ
چۆن بە ئاورینگی نیگایەکەوە زوو گڕ دەگرێ

کێ دەزانێ کە لە دووری وەتەن و یار و هەڤاڵ
چۆن شەوی تار و درێژ لە منی ڕەبەن ڕادەبرێ

کێ دەزانێ، شەوی بێ هەست، بە وەرینی خەزەڵێک
چۆن خەمی یاری لە دەست چوو سەر و دڵ دادەگرێ

ئەو کەسەی هەستی بە سامی شەوی تەنیایی نەکرد
کوا دەزانێ شەمی پێک گەینەوە چۆن هەڵدەکرێ

ئەو کەسەی وا نەچەمی پشتی لە تاو بەژنی زراو
کوا دەزانێ کە چلۆن پەرچەمی ڕاست هەڵدەکرێ

ئەو ئەوینەی بە درێژایی زەمان کەوتە دڵان
کوا بە پشتێک و زەمانێک لە دڵان دەردەکرێ

تا وەبیر دێتەوە یار و گەلی ژێر دەستی نەیار
وەکوو پاییزی چەمەن کەوڵی خەفەت ڕادەخرێ

بەم هەمووو ژانەوە ژەهرەژەمی ژین، تاکوو دەمێ
سەری ئەو شووشە شەڕابەی کە دەڵێم: بادەدرێ

دەردی دڵ کردنی پڕ ڕاز و ڕەمز کەلکی چییە؟
کێ دەزانێ چ لە نێو ئەم دڵەدا ڕادەبرێ

کەرەج- پاییزی ١٩٨٥-١٩٦٤



# ژوانی خۆر

من و تۆ بووین لە مەودای شەو
شەوی لەش سڕ،
لە شەو دڵپڕ
سەفەرمان دوور
لە ڕێگەی سەخت و هەوراز و نشێو و چڕ
بە ئاواتی گەشی بینینی خۆر، دڵ گڕ.

من و تۆ بووین لە مەودای شەو...
کە شەو شەق بوو
لە تاوی خەو وەنەوزت دا،
گوتت تۆ: بۆ ژیانە ژین
لەبەر چی بۆی دەبێ بمرین؟
دەمێ هەر دێ
هەموو سەرچۆپی شایی مەرگی شەو بگرین،
لەبەر چی بۆ خەساری چوو
دەبێ بگرین؟
لە ئاسۆ هەورێ شۆڕابەی
لە قیر وەردا و بەریداوە،

لە ترسی سامی تاریکی لە بەند چوو پێ،
کەحێلی تۆڕی ئاواتت سەری شۆڕ کرد
ونی کرد ڕێ!

من و تۆ بووین لەمەودای شەو
لە دووڕێیانی ڕێی
چوون و نەچوون، بوون و نەبوون
بێ ڕەو...

لە ناکاو یادی ڕۆژی ڕوون
کە دڵمی کردە پشکۆی ناخی سینەی شەو،
گوتم من: قۆچی قوربانی ژیانە ژین،
لەبەر ژینێکی هەرمانە دەبێ بمرین،
بە دەسرەی کفنی سوور
سەرچۆپی شایی مەرگی شەو بگرین.

شەماڵ ماڵی گەواڵی هەوری تاڵ و چڵکنی ئاسۆ،
زەوی و ئاسمان چراخان بوون
بە گڕ گرتن، بە داکەوتن
بە سووتاندن، بە سەرکەوتن
بە ڕزین و هاتنی ئەستێرەکان کۆ کۆ...

من و تۆ بووین لە مەودای شەو



شەوی تاریک و ساردو سڕ،
بەجووت هەردوو لە شەو دڵپڕ

بەڵام
تۆ دەستەوەستانی تەریکی شەو
ئەسیری خەو؛
منیش ڕێبواری گورجی ڕێی ئەوین و ژین
لەبەر پێم تیشکی ئەستێرە،
سەراپا تاسەباری دین و ژوانی خۆر.

تاران- زستانی ١٩٨٥-١٣٦٤

# زوانی ئەوین *

کە لەلاتم وەکوو زنی سکڵی ڕەوان بم، چبکەم!
دوور لە تۆ گیانی هەموو زیندەخەوان، بم چبکەم؟

لە شنەی باوەیە دار سەروی ڕەوان و شۆخە
سروە ئاخی تۆ نەبێ سەروی ڕەوان بم چبکەم؟

پشتی تۆ کۆم و منیش تیر بەرەو جەرگی غەنیم
بە دەس و بردەوە بێ ماڵی کەوان بم چبکەم؟

سواری مەیدانی شەرانخێو و بە بێ ئەزموونم
بێ گوڕەی تۆ کە سواری بدەوان بم چبکەم؟

کەو کەوی نابن و داوناسن هەمووی ئەمڕۆکە
داوی وردی تۆ نەبێ، بازی کەوان بم چبکەم؟

وەختە شێت بم لە سوینی شۆخێ بە ناڵە دەیگوت:
دوور لە دیدەو نەزەری سەروی ڕەوان بم چبکەم؟

پێشڕەوی خێڵی برین! پێشکەوە بۆ ژوانی ئەوین
ڕێی ژوان ڕژد ، کە نەیەی، تازە جەوان بم چبکەم؟

تاران ـ بەفرانباری ١٩٨٥-١٣٦٤

‹ * › لە وەڵامی ( بارگەی یاران )ی مامۆستا (هێمن)دا گوتراوە .



# چۆن دێمەوە؟!

ئەوینەکەم!
بە دڵێکی پڕ ئەوینەوە
هەرچەند جاری بەجێت دێڵم
بۆ هەندەران دەڕۆمەوە ،
مەگری لە دووم
هەر دێمەوە
بەڵام
وەک خۆم
پەشێو بە بۆم،
ـ ئاخۆ ئەمجار چۆن دێمەوە :
وەک زەردەپەڕ دوای تاوپەڕین؟
یان لە چەشنی کاروانکوژە
لە پێش سەرچاوەی نوورەوە ؟
یان سەڵتەزێن؟
یان لەسەر ئەسپێکی تۆسن
بە لاشەو تارای سوورەوە ؟

مەهاباد ـ گوڵانی ١٩٨٦ - ١٣٦٥

# بەهاری زەرد

شینی (هێمن)

وەرە هاوڕێ! وەرە سەیری دەردم
لەسەر ئەم دەردە بەهاری زەردم
لێکدەکەن ڕەنگی بەهار و هی من
لە پەژارە و خەمی مەرگی (هێمن)
وەرە بڕوانە (مەهاباد)ی مە
کە جوانی و گەشی ئەو، شادیمە
نایە لێی دەنگێ لە دووی بێ ئۆخەی
بێ لە هاوار و شەپۆڕ و واوەی
هەرچی بێ گەردە ملی بە کوێنە
هەرچی گوڵمە بە ڕنینێ خوێنە

چەشنی گوزرخانی بەسامن جێژوان
کیژ و لاو لەو کەسەرە وا شێوان،
هیچی یادی نیە ئەوڕۆ پەیمان
دەنگی ئەم ناڵە دەچێ بۆ ئاسمان:

دەک نەبێ ژوانێ بە ڕەشپۆشی بێ
دەردی دڵ کردنێ بێ خۆشی بێ

سەر نەوی کردنە بەرەو ڕووی قوبڵە
خەڵکی (شوانان) و (گومرگ) و (قوبڵە) ‹*›
(رزگەیان)، (ئەرمەنیان) و (سێئاش)
(تەپی تابانی)، (خڕێ) و (سەربەرداش)
پاکی هەرد دەکوتێ بە نێو چاوانی
دەست بە ئەژنۆن هەموو، تۆ نازانی:
نوێژی ئێوارەیە، چۆک دادانە؟
یانە کڕنووشی بەرەو قەبرانە؟

شادی خەمبار (بداق سوڵتان)ە ‹١›
فەخرە بۆی هاتنی ئەم جیرانە
کەچی دەڕوانێ وەکوو جارانە
ئەمەگی خەڵکی نیشانەی مانە
هەرچی فرمێسکی گەشە دەیڕێژن
نایدەنە خاک و لە دڵ دەینێژن

‹*› شوانان، گومرگ، قوبڵە، رزگەیان، ئەرمەنییان (ئەرمەنی) سێئاش (سێئاشان) تەپی تابانی (تەپی تابان)، خڕێ و سەربەرداش ناوی چەند گەڕەکی لەمێژینەی شاری مەهابادن.
‹*› بداق سوڵتان ناوی پیرو چاکێکی بەناوبانگە. لە باشووری مەهاباد و هەر لەو گۆڕستانەی کە (هێمن)ی لێ نێژراوە ،هەڵکەوتووە.



دڵە! هەرچەندە برینت سەختە
گیان لە لەش دەربچێ لێرە وەختە
سەرێ با روو لە دەرەی (لاچین)‹٢›کەین
دوور لە چاوان بگرین، سەر شین کەین
خۆ لە ئامێزی (قەلات)ێ‹٣› باوێین
بەڵکو هەندێ کوڵ و کۆ دەرباوێین
لە (موغارێ) و قەد و لووتکە و داوێن
بە هەنیسکی لە کوڵی بەردتاوێن
زیندی تاساو و پەشێو ڕاژێنین
(سارم)‹٤›ی جەرگ بڕاو لاوێنین

هەڵگەڕێین بۆ سەرو (شیلاناوێ*)
چاوێ لەو ناوە بگێڕین تاوێ:
ئاخۆ هەر دار و کەژی ئەو نێوە
ڕەمزی سەربەرزی و مەزنی خێوە؟
ماوە شەوگوردی کوڕی گونداو گوند؟
ماوە ئەو بیری فڕی دونداو دوند؟
ماوە گوێگرتنی تووڕەی بلوێر
کاتی خەو، لەو کەژ و شاخی زەنوێر؟

‹٢› گوندێکی سەر بە مەهابادو زێدی (هێمن)ە.
‹٣› یان (قەلای سارم) کێوێکە لە پشت لاچین.
‹٤› سارم بەگ سەردارێکی کورد بووە کە وەختی خۆی لە شاخی قەلات قەلاو مەتەریزی هەبووە.
‹*› شیلاناوێ لە ژووروی (لاچین)ە.هێمن زۆربەی تەمەنی لەو گوندەدا تێپەڕ کرد.

ئێستەکەش خۆشە شەوی بێدەنگی ؟
دێتە گوێ شین و گرووی یەکرەنگی ؟
دەردی دڵ کردنێ لەگەڵ ئەستێران
دادەمرکێنێ کوڵ و کۆزی مێران ؟
کانی دڵڕوونکەرەوەی (پیرێژن*)
سەردە ئێستەش بە هەناسەی (هێمن) ؟
شەنگەبێری لە شوان دەڕوانێ
بێتەوەو کوێنی ملی پێ دانێ ؟
«دێم و دێم» دێتە گوێی «خانمی دێ*»
گیان بکێشێتە پەنا پەردەی گوێ ؟ <.>
شایی هەر ماوە (هەژار) هەڵبپەڕێ <.>
دۆیەکی بێتە دەس و جەرگی تەزێ؟ <.>
یانە لێی نایە چ جووکە و نووکە <.>
ماتە بۆو بولبولە سەر بێ تووکە ؟ <.>

دڵ کە جوێ نابێ لە (قەبران) تاوێ
دەفڕێ تەیری خەیاڵم تا وێ :

<*> کانی پیرێژن کانیاوێکە بەرانبەر بە ماڵەکانی شیلاناوێ.

<*> خانمی دێ، مەبەست خێزانی مامۆستا «هێمن»ە کە خەڵک پێی دەڵێن: نایشە خانم.

<.> ئەو پێنج میسرەعە لە « بۆ کوردستان »ی مامۆستا هەژار وەرگیراون و هێندێک دەسکاری کراون.



(کانی پیرێژن)ی (شیلاناوێ)
ئاوی سەرچاوەی ئەمڕۆ ناوێ
هێندە گریاوە بۆ یاری گیانی
پێلی دەریایە کەلاوی کانی

ئاشەکەی کۆن و کەلاوەی سەر دێ
ئاوەدان بۆتەوە بۆ شینی نوێ
بەردی بەرداشی (قەلاّت)ە و (هەڵگورد)
سوێسن و لالە دەهاڕێ ورد ورد

لە بنار گردی هەوارە بەردە <*>
کەو سیاسووتە و سووت لەو دەردە
هێند بە دەنگ بەرزی لە بەرزایی دێ
گوتی: جێی بەرزی دەوێ شینی وی
هەڵگەڕا بۆ سەری کێوی (چەکوچی*)
شینی شاشین بێ، بە دەنگی چەکوچی

(کێوە ڕەش) سەر بە هەش و ڕەشپۆشە
ژینی کەژ دوور لە هەڵۆ ناخۆشە

<*> قەبران: لە مەهاباد بە گۆڕستان، زۆرتر (قەبرستان) و «قەبران» دەڵێن.

<*>هەوارە بەردە ڕەوەزێکی پشت گوندی شیلاناوێیەو کەوگرە.

<*>کێوی چەکوچی کەلە بەرزترین کێوەکانی ناوچەیە، لە ژووری « شیلاناوێ» هەڵکەوتووە.

له هەواری سەری «کرماویلێ*»
شوێنی هەڵدانی کوڵی دڵ کەیلێ
شەنگەبێری بە هەنیسکان دەگرێ
شوان نەما تاوەکوو فرمێسک بسڕێ

ئەو «هەمین»ی کە بە دانەی خاڵی
«هێمن»ی بردە «هەواری خاڵی*»
پێی فڕێ داوە شەدە و دەسماڵی
دەردی بینینی هەواری خاڵی

دەردی ئەو ناوە، بە تینی توانە
وەرەوە خواری خەیاڵ! لەو بانە
هەرچی شینکەی کە لە دەشتێ شینن
هەموو سەر شین و خەریکی شینن
شینی شینگێڕی گوڵی پەڕ پەڕ بوو
کە لە شینی، گوڵی گەش پەڕ پەڕ بوو

(*) کرماویلێ هەوارگەیەکە، لە سەرووی شیلاناوێیە.
(*) ئیشارەیە بە کورتە چیرۆکی (هەواری خاڵی) هێمن.



کاکی جووتێری بەری «سەردەشتان*»
دوژمنی کۆنی وچان و وەستان
دەستی قەڵشیوی لە پاشبارە شل
بوورە دەدوێنێ دژ و لارە مل:
کێیە ئەمجارە بە ئەوکی زنڕین
بۆم بلێ شیعرێ کە ئارەق بێ و تین،
پێم بلێ چۆن لە مەچەک رابینم
چۆن لە کار کاوی دڵ و ژین بینم؟

وا خەیاڵ لێرەوە دەڕوا لە سوێی
ناڵەیی «سروە*»، کە: بابە لە کوێی!؟
هەوری بۆری سەری «گۆلی ورمێ*»
بە کزەی سروە قژی خۆی دەڕنێ
هەور و ئاو هەردوولە باوەش یەکدان
قەت نەبوو هێندە نەوی بێ ئاسمان...

بەسیەتی بیری دڵی شێواوم
وەرەوە لای دڵی لێقەوماوم

(*) سەردەشتان کۆمەڵێک مووچەو مەزرای (لاچین)ە.
(*) سروە: گۆواری سروە کە (هێمن) وەڕێی خست.
(*) هێمن لە ورمێ مرد و بە پەنا گۆلی ورمێدا هێنایانەوە مەهاباد، هەروەها (سروە)ش هەر لە ورمێ دەرچوو.

شینە دڵ، سووری ئەتۆ، زەردم من
با بدەین دەورە لە گڵکۆی (هێمن)
ناڵەمان گەرمی بکا دیلانی
نەک بڵێ: ڕەشبەڵەکی من کوانی؟*
چاوە! هەڵچۆڕە، بە ئاهەنگ بگری
دڵە! سەرچۆپی بەدڵ بۆ بگری
تۆم کە ناسی بە خەیاڵم لەو بوو
پێگەیی بیری مناڵم لەو بوو
هەستی بێ خەوشی ئەوینم لەو بوو
بیری رازێنەری ژینم لەو بوو
بیری: سووتان وەکوو خۆری سەرکەل
وەکوو مۆم ڕوونکەرەوەی بەزمی گەل
بیری: شەوگارە کە دیلی چوونە
بیری: هیوام بێ کە «ئاسۆ ڕوونە»
شوێنی ئەم پەندە لە دڵ هەرمانە:
لە ئەوین رایە کە دنیا جوانە*

دڵە! بۆ یەکتر ئەمە ناسیاوین
هەر خەیاڵە کە فریوی داوین

<*> مەبەست لەو بەیتە شیعرەی هێمنە کە ئێستا لەسەر بەردی گڵکۆکەی هەڵکەندراوە:

کیژ و کوڕ بگرن لە دەوری گۆڕی هێمن ڕەشبەڵەک
من کە شینگێڕی شەهیدانم لە کوێ شینم دەوێ

<*>مانای میسرەعێکی «هێمن»ە:

لە سایەی عیشقە ئەم دنیایە ڕوونە



ئەگینا کوانێ وزە بۆ دیلان
لێرە ئەمڕۆکە هەیە بۆ دیلان

شەرتە تۆ یادی بکەی هەر ساتێ
بۆ گرین هەوری بەهار ئەمگاتێ
تاکوو ئەو میسرەعە بۆم بێتە ژوان
«تەک و تەنهام و عەزیزانم کوان؟»
دەس لە مل بووکی ئەوین ئاڵێنم
لەگەڵی گەرم و بە سۆز ناڵێنم
بە مۆژە و جەوهەری سووری ئەسرین
هەر بنووسم شەو و ڕۆژ شیعری شین

بەهاری ١٩٨٦ - ١٣٦٥

# یادی ئاگرین

هەسێرەکەی هەرێمی ئاسمانی دڵ!
دڕووی دڕی دەروونی شەو!
دەکەی ڕەوەک
لە چاوەکانی هەردوو خەو:
لە دڵ، بە یادی ئاگرینەوە
لەشەو، بە ئێشی بێ بەزەی برینەوە.

* * * *

شەوەو
لە هەر دەمێکی زیندەتر
دڵی لە کوڵ بە ژان و بێکەسە،
هەناسەیەک
کە بێتە دەر لە ناخی تاسەیەک
لە بۆ ڕفاندنی لەشی زەعیفی من بەسە.

* * * *

گوڵم!
کوڵی دڵم!
بە نازی جار بە جارە مامزی سڵم!
لە بەردەلانی سەخت و ڕژدی ئەم هەرێمە دا
کە فێری دارە دارە بووم،
لە نێو هەزارە کوێرە ڕێی
کە فێری پێ بڕین
بڕینی بازی چارە بووم،
بە عیشقی تۆوە بوو.
چلۆن دەبێ
کە تەرکی کەم هەرێمی تۆ؟
کە جوانی ئەو
لە عیشقی تۆوە بوو...

* * *

ئەونستە من هەمو
دوو چاوی تاسەبار
دەپشکنم هەموو کەلێنی ئەم شەوە،
هەتا بدۆزمەوە
دوا بزووتی ئاگرێکی شەو بەزێن،
بە دەم هەناسە بیگەشێنمەوە،
لەشی سڕم،
دڵی لە نائومێدی ڕەش پڕم
بژێنمەوە،
بژێنمەوە.

تاران: ١٩٦٨- . ١٣٦٥/٣/١



# پێکەنینی دەریا

شەپۆلێک بووم
لە ڕەشترین شەوی شەوین
دەریام هێنایە پێکەنین
بە بوون، ئەوین، بە ژین،
گاشەی بەستەم هێنا تەزین.

* * * *

شەپۆلێک بووم ماندوو، شەکەت
بە تاسەوە
لە چاوەکەی چاوی تۆدا تلامەوە،
لە خاوێنی و لە ڕوونی‌دا حەسامەوە.
زانیم: ئەگەر
لە نێرینەی دەریاوە من
هەروا بە گوڕ ڕاست بیمەوە،
بۆ بەیانی
لەسەر سینگی دایکی هەموو چاوە کانی
لە ئامێزی گەرمی خۆردا
ئارام دەگرم،
دەریا بە شەو نابینمەوە.

تاستارا: ١٩٨٦-١١/٤/١٣٦٥

# رازی پیرۆز *

لە بەرزایی چیا ، چاوی هەڵۆ پشکووت .
لە نێو تۆفان بەخۆداهات ،
بەسەرما و با و بۆران و هەور ڕاهات .
ئە هەر پێی وابوو کە
بەرزە فڕە ،
بەرزە نشینیشی
هەوایەک بوو .
کەچی ، کاتێ هەتاو ئەنگووت
چیاکەی مشتێ زیخ و خۆڵ وەبەر چاو هات ؛

لە قەدپاڵی چیا
چنگی بە قەو داگرت
هەڵیکێشا بەرەو جێژوانی لووتکە و خۆر ،
وەکو تیرێ لە سینگی هەورەکان ڕاچوو...

مەخابن !
هێندە تەنیا بوو

لە نێو تۆفانی ٚ تێدا چوو.
سبەی
لالەی بناری کێو
بە سرتەی سروە با دەیگوت:

چ رازێک هێندە پیرۆزە؟
لە دایکبوون لە نێو تۆفان
لە دنیا چوون لە نێو تۆفان!

تاران ١٩٨٦- .٢/٤/١٣٦٥

* ئەو شیعرە ماکەکەی لە شیعرێکی ئازەربایجانی وەرگیراوە.



# پـــەردە

" بۆن بە دەمتەوە دەکەن
نەکا گوتبێت:
خۆشم دەوێی! "

(ئەحمەدی شاملو)

هەر بڕوانی
ورد ورد چاوت دەپشکنن،
نەکا وێنەی چەند جوانێکی هەڵگرتبێ!
چاوەکانت ـ چاوەی هەتاو ـ
لە ژێر پەردەی ئیشارەدا بشارەوە
با ڕۆژی خۆی
بەو چاوانە
دژی جوانی بسووتێنم.

هەر شل بڕۆی
بەند بەند باڵات تێکدەشکێنن!

بەژنت
لە ژێر پەردەی جلکی خاکی ڕەنگا بشارەوە ،
با ڕۆژی خۆی
بەو بالأیە
سێدارە بۆ دژی جوانی دامەزرێنم.

هەر سەر رووت کەی
تا تا بسکت هەڵدەپاچن!
بسکەکانت
لە ژێر پەردەی جامانەدا بشارەوە
با ڕۆژی خۆی
بەو بسکانە دژی جوانی بخنکێنم.

بەڵام
نەکەی دەمت لە ژێر پەردە باوێنی ،
هەرچەند ڕۆژێ سەد جار بڵێی:
خۆشم دەوێی!
لەگەڵ دەمت کارێک نایە ،
چرۆیەکە نەپشکوتووە
وەبەر هەموو چاوێک نایە .

تاران ١٩٨٦-١٤/٥/١٣٦٥



# ماچم بکە!

من پێم گوتی: خۆشم دەوێی!
تۆ پێت گوتم: دەتپەرەستم!
بەڵام پەرژینی شەرمی کوردانەت
نەیهێشت
بۆ جارێکیش ماچم بکەی
دامرکێنی گڕی هەستم.

* * * *

چەند شەو لە ئاسمان ڕامام،
نەمدی تەنیا ئەستێرەیەک
بدرێ سینەی شەوی بەسام،
چاوم خێل بوو...

چەند شەو بە تاسە گوێم ڕاگرت
بۆ ترپەی پێی ڕاسپێری تاو
ئەژنۆم داهات، دەنگێ نەهات
وا گوێم شل بوو...

خۆشەویستم!
شەو درێـ.....ژە ،
خەو
بە مەودای چاوەڕوانی
خۆی لێگرتووم؛
با خەیاڵی ماچی هەتاو
لەسەر گۆنای ئەم هەرێمە
لە بیر نەکەم،
ماچم بکە
ماچم بکە .

تاران گەلاوێژی ١٩٨٦-١٣٦٥



# چیـــا

لە پاش دایە و بابە و دادە
گوێم بە ناوی چیا ڕاهات.

* * * *

ئەو دەمەی کە پێم گرتبوو
کەند و لەندی حەوشەم دیبوو،
هێشتا چیای پشت ئاوایی لێم نەدیو بوو
بەڵام، زۆر جار ناویم بیستبوو.

ئەوکاتەی کە پەرەواژە بووم،
دەنگی گەمەی منداڵەکان کەوتە بەر گوێم
وەک پەپوولە
بە نێو دێ دا
هەڵوەدای ئەم ئاوازە بووم،
چیای بەرزی پشت ئاوایی لەبەر چاوم:

نیوەڕۆیان کۆگایەکی بەرد و گڵ بوو؛
ئێوارانەش تاپۆیەکی داخ لە دڵ بوو.

زستان ڕۆیین، بەهار هاتن
هاوین زەرد بوون، پاییز سڕ بوون
لێرەو لەوێ
بەرزیی و نزمیم لێک کردەوە.
ئەمجار زانیم:
چیای بەرزی پشت ئاوایی
گەلێ بەرزە!

لەو کاتەوە، گێژ و وێژی
نێو گێژاوی ئەم ڕازە بووم:
ـ ئەو چیایە بۆ وا بەرزە؟
یەکەم کلوو بەفری زستان لووتکەی دەگرێ،
دوایین کلووش
لەسەر لوتکەی ئەودا دەمرێ؛
هەرچی با و بۆران هەیە
یەکەم مزڵی ئەو شوێنەیە؛
هەر بەهار و پایزێک دێ
وێنی دەکەوێ
هەوەڵ زڵلەی سڕی تەرزە؛
کەچی دیسان هەروا بەرزە
هەروا بەرزە!



بۆم چەتوون بوو دڵنیابم
ئەو بەرزییە بەبێ ڕەمزە.

چەندین ساڵان
گێژ و وێژی نێو گێژاوی ئەم ڕازە بووم:
بۆ وا بەرزە ئەم چیایە
خۆشی بەرزی لەچی دایە؟!

تا ئەوەیکە
بەیانییەک لە ڕێی مەزرا
دیتم بەر لە هەموو جێیەک
گزنگی تاو لووتکەی ئەنگاوت؛
کاتی چاوەڕوانی هەوەڵ ژوانی بەشەو
دیتم دوندو ئامێزی ئەو
لە ئەستێرە ژاوەی دەهات.

ئەو کاتە بوو تێگەیشتم:
بۆ چیایەک
گەرچی بەرزیی
زڵلەی تەرزە و تەزووی بەفری بە دواوەیە،
بەڵام
ژوانی ئەستێران و
ماچی خۆری بەلاوەیە.
تاران گەلاوێژی ١٩٨٦-١٣٦٥

# گڕووگاڵ

ئەو گوڵەی دایمە لە نێو دڵ دایە
هەرچی دەیکەم لە ژوانم نایە

هیچ شەوێ نایە خەوم بێ خەونی
هەر کە ڕۆژ دادێ لەگەڵ من لایە

تووشی تووشی دێم هەتا تووشی دێم
کە ئەیەم دڵ لە گڕوو گاڵایە

وەختە گیان دەرچێ لە تاوی، چبکەم
ئەوی دڵ دەیلێ، زمان بۆی نایە

گەرچی من دڕکم و ئەو گوڵ، ئەمما
ڕیشەمان هەر دوو لە یەک گڵ دایە

قەت نەبوو یار و وەتەن لێم ون بن
چاو کە لەم لا بێ، دڵم لەو لایە

بێتوو ڕیشەی من و ئەو لێکهاڵێ
هەرچی تۆفانە لە لام شیبایە

مەهاباد سەرماوەزی ١٩٨٦-١٣٦٥

# کـەی تێر دەبین؟!

ژوانی یەکەم
دەستمان لە نێو دەستی یەکدا مەیین.
تا توانیمان
چاوەکانمان لێکتر بڕین،
لێک تێر نەبووین.

دوێنێکانە
سینگمان بە سینگی یەک گوشی،
تا توانیمان
لێوەکانی یەکمان مژی،
هەر تێر نەبووین.

ئەمڕۆکانە
بۆ مژینی گۆی مەمکۆڵەی تورت و کورتت
وەک منداڵی ساڵی بێ ئاوی و گرانی
لە دوێنێکە تینووترم.
سبەی گیانە!

بۆ خەونێکی ئارامی سەر سینگی نەرمت
لە سەری شەو تا بەیانی
لەمرۆکانە تینووترم...

کەی تێر دەبم ؟
خۆم نازانم.
تۆ پێم بڵێ:
کەی تێر دەبی ؟
کەی تێر دەبین ؟

مەهاباد ، ١٩٨٦-١٣٦٤/٩/٣



# هەتاو ناکوژرێ

هەرچی توانی
کردی دوژمن...
هەرچی توانی
بردی دوژمن. . .
بەڵام
هەرچەند کە هەوڵی دا
چی بۆ نەکرا
لەگەڵ تیشکی
ئەو هەتاوەی لە رۆژهەڵات دەرکەوتبوو ،
ماوەیەک بوو
لوتکەی چیای ئەنگاوتبوو.

مەهاباد ، پاییزی١٩٨٦-١٣٦٥

# ژوان

تا پێنم دەڵێی: لێت نەبانم
شیعرێکی تەڕ دێتە ژوانم

هەرچەند جاری دێیە ژوانم
لە سەت شیعری تەڕ میوانم

مەهاباد، ١٩٨٦-١٠/١٠/١٣٦٥

# دەستم بگرە

دەستم بگرە
لە ڕێگەی پڕ کەند و لەندی
هەوڵی سەخت بۆ ئینسان ـ بوون.
بە تەنیایی
هەر کەندالێک هەڵدێرێکە.
دەستم بگرە!
با بکەینە پێخۆری پێ
گشت هەورازی ڕژدی سەر ڕێ.

دەستم بگرە
دەستت دەگرم
بە دوو دەستی وەفا و ئەوین،
بۆ ئینسان ـ بوون،
بۆ ماناداں بە بوون و ژین.

مەهاباد، ١٩٨٧-٢٧/١٠/١٣٦٥

# لەسەر دایە...

شەهیدم خۆشدەوێ ئەمما ، لە هەرچی مەرگە بێزارم
ژیانم خۆشدەوێ ئەمما لە هەرچی نەنگە بێزارم

خەیاڵی چوونە بەرزاییم لسەردایە بەسەر،ئەمما
لە هەر ڕێیەک کە کوێر و خوار و خێچ و تەنگە بێزارم

مەهاباد ،خاکەلێوەی ١٩٨٧-١٣٦٦

# بووکە بارانە

ماوەیەک بوو
لە گۆڕین زەوی، نیگام
لەسەر سینگی ئاسمان هەڵقرچابوو . .
چاوەڕوانی خەڵکی تینوو
هەست و بیرمی هەڵپێچابوو :
ئەمساڵ نەکا باران نەبێ
قات و قڕی تووشمان ببێ .

ڕۆژێک دیتم
پۆلێک منداڵ
دارێک بە دەست ـ قوماشێکی سووری پێوە ـ
هاوار دەکەن:
« بووکی مە بارانی دەوێ
ئاوی نێو دەغلانی دەوێ... »
هەر دەرگا بوون دەکرانەوە ،
هەر ئافرەت بوون بە دەفرێکی پڕ ئاوەوە

دەڕژانە نێو کۆڵانەوە.
قوماشی سوور
هەروا دەهات تەڕتر دەبوو
بەڵام،
ئاسمان نە دەیدیتن، نە گوێی لێبوو.

کە داپیرە بە کۆمە کۆم
بە لەرز و لەز
خۆی گەیاندە بووکۆڵەکە و
دەفرێک ئاوی بەسەر داکرد،
ئەمجار باری
باران باری
بە خوڕ باری
لە چاوی من!
بۆ بێ ئاوی و
ڕەنج خەساری.

مەهاباد، گوڵانی ١٩٨٧-١٣٦٦



# من شاعیر نیم!

تۆ ڕاست دەکەی:
من شاعیر نیم!

من ساحیر نیم
لەشەوێکدا
هەموو کیژ و کوڕی دڵدار پێک شاد بکەم؛
لە ساتێکدا
هەموو مەلانی نێو ڕکە ئازاد بکەم.
من هەر ئەوەندەم لەدەست دێ:
خەونی خۆشی هەموو لاوان
بەچەند دێڕێک
بۆ کیژۆڵان بگێڕمەوە؛
بە سەربەستی و بە بەستەی خۆم
خۆشی فڕین و ورینگە
لە نێو زەینی هەر مەلێک دا بڕێنمەوە.

* * * *

تۆ ڕاست دەکەی. من شاعیر نیم!
من ساحیر نیم
سفرەی ماڵی هەژارەکان
هەر بە فوویەک ڕەنگین بکەم؛
سیمای زەردی کۆرپەی برسی
نەخشین بکەم.
من هەر ئەوەندەم لە دەست دێ
هاوار بکەم:
ئەی هەژاران!
زۆر سفرە هەن
کە بە خوێنی ئاڵی ئێوە
ڕەنگین دەبن؛
لێوی بەبار، کوڵمی چرچ و چاوی ڕۆچوو
بە سێ ڕەمزی
کار و خەبات و یەکگرتن
نەخشین دەبن.
من ساحیر نیم
گوڵی ئاوات
لە نێو بەفری بێ بڕوایی‌دا بڕوێنم.
من هەر ئەوەندەم لە دەست دێ:
تۆوی بڕوا و هیوا و ئومێد
لە نێو مووچەی خەم داچێنم.

* * * *



من نیم
ئەو شاعیرەی تۆ گەرەکتە
هاوڕێ!
من ساحیر نیم.
من ئەو کەسەم:
لەگەڵ گزنگ بزەم دێتێ،
لەگەڵ هەور گریانم دێ،
لە ژێر کێوی کەند و کۆسپا
هیوا و ئومێد دێتە ژوانم.
من
ئینسانم.

مەهاباد، ١٩٨٧-١٣٦٦

# ساڵی نەهات

ئەی هەورەکان!
ئەمساڵ لەکوێن
گەرد و تۆزی
ساڵی نەهات
ساڵی وشک
ساڵی بێ فەڕ
لە ڕوخساری ئەم وڵاتە بشۆنەوە ؟

ئەی هەورەکان!
ئێوە نەبن
کەژ و چیا کورت دەنوێنن؛
بەهار نایە و
باڵندەکان خەم دەخوێنن.

ئەی هەورەکان!
جامانەکەی رەش و سپی سەری کێوان!
ئەمساڵ لە کوێن ؟
ئەمساڵ لە کوێن ؟

مەهاباد ،بانمەڕی ١٩٨٧-١٣٦٦

# جێی ژوانی خەیاڵ

شەوێک نیە
لە خەونْدا سنوور نەپەڕێنم
باوان و ئازیزانم نەدوێنم.

شەوێک نیە لە جێی ژوانی خەیاڵا
دەگەڵ خۆشەویستم
بەیەک نەگرین بەژن و باڵا...

بەیان نیە
بۆ تەنیاییم
بۆ جودایی و هەڵوەداییم،
سەرینەکەم
بە فرمێسکی تاڵ و سوێرم
تەڕ تەڕ نەکەم.

گەوەڕ ‹کوردستانی تورکیا› گەلاوێژی ١٩٨٧-١٣٦٦

# ناڵەی بە سۆز

زۆرتر لەوەی ئاوارەیی
دەربەدەری و غەوارەیی
خۆشیان دەوێم،
خۆشم دەوێی ئەی یارەکەم.

زۆرتر لەوەیماڵی باوان
کووچە و شەقامی نیشتمان
بیرم دەکەن،
بیرت دەکەم ئەی شارەکەم.

زۆرتر لەوەی ناڵەی بەسۆز
خووی پێگرتووم
خووم پێگرتووی هیواداری.

زۆرتر لەوەی مەرگی پیرۆز
تاسەم دەکا
تاسەت دەکەم ئەی رزگاری.

ئانکارا ، پاییزی١٩٨٧-١٣٦٦

# ئەزموون

هات و چووی زیندەی دەوێ تا هەندێ ئەزموون دەس کەوێ
زیندە ئەزموونی دەوێ تاکوو لە چوون، بوون دەس کەوێ

هات و چووم زۆر کرد لە کەندو لەندی ڕێی ژیندا، کەچی
ڕۆژ بە ڕۆژ ئەزموونی تازە پێم دەڵێ: زیندەی دەوێ!

تورکیە ۱۹۸۷-۱۳٦٦

# تۆ ناوی بنێ *

ئەستێرەکان پۆل پۆل هەڵدێن
بەڵام ، ئەوانەی رادەخوشێن
بە ئەنگوستان
دەژمێردرێن .

ئێمەش هەموو پۆل پۆل هاتین
بەڵام شەوێک
بۆخۆم بیستم لە ئەستێران :
ئەو کوردانە
بە ئەنگوستان
ناژمێردرێن !

تورکیە . پاییزی ۱۹۸۷-۱۳٦٦

* سەردێری شیعرێکی « نەژدەت چەلیک » شاعیری تورکە .

# تاوێك لە پاتیناز

ناڵێم ئەتۆ
پەری بەرگ ڕەشی
لەسەر هەور ـ هەوری سپی ـ
بە نازی مامزانەوە هەڕا دەکەی.
کیژۆڵەیەکی چاو ڕەشی
بە جلکی ڕەش
لەسەر سەهۆڵ سەما دەکەی.

ناڵێم ئەتۆ
کۆترێکی ژیکەڵەی ڕەشی
لە ئاسمانی ساوی بەر بەیانییا
بەرز دەبی،
نەوی دەبی بە نازی تەقڵەوە،
سەرێک دەچی بە تاو و لەز
سەرێک نەرم نەرم
بە هێدی دێیەوە.

نالْیم ئەتۆ
قووی گەردن کیلی پۆ ڕەشی
لەسەر کەفی سپی شەپۆل
دێی و دەچی بە نووکی پەنجەوە
بە لەنجەوە
منەت لەسەر دەریا دەکەی.
کیژۆڵەیەکی چاو ڕەشی
بە جلکی ڕەش
لەسەر سەهۆڵ سەما دەکەی.

ئەتۆ قوو و پەری و کۆتری
ئەمن هەورو شەپۆل و ئاسمان.

کیژۆڵەیەکی چاو ڕەشی گەشی
هەوێنی شیعرێکی
منی غەریب و بێبەشی.

ئانکارا، ڕێبەندانی ١٩٨٨-١٣٦٦



# تاسە

دەمەوێ بتوێنمەوە
لە درێژایی ئاسۆگەدا ،
لەو شوێنەدا کە
دەریا کۆتایی دێ و
ئاسمان دەست پێ دەکا...

(مارگوت بیکێل) شاعیری ئالمانی

بە تاسەوەم بتوێنمەوە
لە درێژایی ئاسۆگەدا ،
لەو شوێنەدا
کە کێوەکان دەبڕێنەوە و
دەریەدەری دەست پێ دەکا.

بە تاسەوەم بتوێنمەوە
لە نێو هەموو ئەوانە دا

خۆشم دەوێن
بۆیان دەژیم،
بەڵکو ئاوا
خۆم تێبگەم
- من کێم و
چیم؟

بە تاسەوەم بتوێنمەوە
لە درێژایی ئاسۆگەدا
لەو شوێنەدا
کە کێوەکان دەبڕێنەوە و
دەربەدەری دەست پێ دەکا.

تورکیە ،ڕەشەمەی ١٣٦٦-١٩٨٨



## نـــــەورۆز

وا هەست دەکەم
ئیمشەو
هەموو گرد و چیاکانی کوردستانم
لە نێو دڵم دەڕوێن.

وا هەست دەکەم
ئیمشەو
هەموو دار و گیاکانی کوردستانم
لە نێو دڵم دەگرێن.

وا هەست دەکەم
ئیمشەو
لە گشت ساتێک زۆرتر
خەیاڵم پیرۆزە
ناڵە ناڵم بەسۆزە:
بۆ بەیانی
لە کوردستان
بەبێ من نەورۆزە.

تورکیە ١٣٦٧/١/١-١٩٨٨

# پرسیارێک

« سەیر دەبێ
ڕۆژێک عیسا بێتەوە و
ڕەنگی پێستی وەکوو ئێمە ڕەش بێ... »

( لانگستن هیووز )

لەم جێیەی کە
مزگەوتەکان، منارەیان
لەگشت شوێنێک بەرزتر دەنوێنێ،
سێدارەی بەرزتر هەڵدەخەن
بۆ ئەو کەسەی
هەر ناوی کورد بێنێ!

ئەرێ کاکە!
ئەگەر « محمد » کورد بوایە،
ئاخۆ بڵێی
منارەیەک
لەم ناوە هەبوایە؟

تورکیە ١٩٨٨-١٣٦٧

# تـــه نـــیا مه یـــه!

« تەنیا وەرە
هەروەک لە ناو دڵما تەنیای... »

عەبدوڵڵا پەشێو

نووسیوتە: دێم
کەی دێی گیانە!
تا بزانی
چەند چاوەڕێم؟
بەڵام
تۆ بێ زوو هاتنت
ئەگەر هاتی تەنیا مەیە:
لوێچێک خاکی کوردستان ـ یش
لەگەڵ خۆتا بێنە،
بە دەستی خۆت
ئەو کلە پیرۆزە
لەو چاوە سپی بوویانەم وەرێنە.

نووسیوتە: بێم
بەشی هەموو شەوانی دووریمان
دەردی دڵ و گلەییت بۆ دێنم.
کەی بۆم دێنی
تا بزانی
چەند وەڕەز بووم
هێندەی دار و بەرد و خۆم بدوێنم؟
بەڵام
تۆ بێ دردی دڵت!
ئەگەر هاتی
هەروا مەیە:
بەر لەوەی بێی
تاوێک چیا ـ م بۆ بدوێنە،
بەشی هەموو رۆژانی دووریشمان
دەردی دڵ و داد و کوڵی
ئەو کۆنە دەسگیرانەم بۆ بێنە.

تورکیە ،بەهاری ١٩٨٨-١٣٦٧



# بێ تۆیی

دانەمرکا کوڵ بە دین، ویستم لە دووتا بێم نەبوو
هێندە گریام پێم لە قوڕ گیرا، بڵێم چی ڕێم نەبوو

خۆزگە گریابام لەباتی تۆش و چاوت سوور نەبا
(بەحری سوورو ڕەش) ١ لە چاوما بوو، بڵێم چی جێم نەبوو

نایەڵن سەر بەرز و ڕووسوور بێمەوە گیانە! دەنا
ڕەنگە باڵ دەرهاتبا لەو خۆشییە، گەر پێم نەبوو

نابینی چۆن چەم لە چاوا چێ دەکا (لاچین) ٢ ، هەتا
تێ بگەی:کەی بیری بێری و شاخ و کانی و دێم نەبوو

دەردی بێ نانی و وەتەن بێتوو نەبا گیانە! چلۆن
تاسەی چێژی مژینی لێو، گوشینی بێم نەبوو؟

خۆ لە بیرم بوو دیاری بۆ وڵات و یار، بەڵام
رۆژی هەوەڵ گیان و دڵ جێ مابوو، لێرە پێم نەبوو

چاوەکـــانم هاتنـــەوە (ســـێ ڕێـــی وەفایی ٣ ســەیر کـــەن
یەکی خـۆشـت با دەگـــەڵ بێ، خـۆش بە لـــێم گەر سێـــم نەبوو

گـــەرچی بێ تۆیی عـــەزیزم ســـەخـــتـــە، بێ تۆش هەر دەژیم
تا دەگـــــەڵ گـەڵ بم بە دڵ، بێ تۆ، بڵـــــێم جا کـــێم نەبوو

قەیسەری ،هاوینی ١٩٨٨-١٣٦٧

‹١› «بەحری سوور» و «بەحری ڕەش» دوو دەریای دەوری ئیستانبوول ـ ن.
‹٢› گوندی لاچین سەر بە مەهابادە و شوێنی لە دایکبوونی شاعیرە.
‹٣› «سێ ڕێی وەفایی» شوێنێکە لە مەهاباد.



# شیعرو
# کۆچێکی نیوەچڵ

هێند ڕاونرام
هێند دەرکرام
هێند کۆچ درام
«سەگی هیچ کونێم پێ ناوەڕێ ١ ».
خۆشیان ناوێم:
ماندووم کردوون
هێندەی شەو و نیوەشەوان
خەوی خۆشیان بڕەوێنم.

هێند ڕاونرام
هێند دەرکرام
هێند کۆچ درام
هیچ ڕێگایەک نامۆییم لێ ناکا.
خۆشیان دەوێم:
بەسەرماو سۆڵی زستانێ
بە قرچە قرچی هاوینێ
بە پێخاوسی دەیانشێلم،

قۆڵنجیان دەشکێنم.

* * * *

ئەی ئەوانەی
بە زۆر ناوی (کۆچەر)تان بەسەر دابڕیوم،
ئەی ئەوانەی نەوناسیوم!

کوڕی نۆبەرەی کامەتان
لە (ئیندرقاش)
سەری بە گوڵمیخ و بزماری هەشتەرخان
وەک وێنەکانی (پیکاسۆ) ـ کە تێی ناگەن ـ
لەسەر دیوارتان داکوتراوە؟

کچی تاقانەی کامەتان
لە (هەڵەبجە)
لە باوەشی
دایکی لە پێش خۆی مردووی دا
توایەوە،
تەنیا دوو چاوی شینی لێ ماوە
لەسەر سینگی خاتوونی سەرمایە
بە هەودایەک ئاڵتون
هەڵواسراوە؟



تەنیا ئەوەی گەڕانەوەی لا شیرین بێ
دەزانێ: دووری چەند تاڵە...
تەنیا ئەوەی (هەڵەبجە)ی لەبیر بێ
دەزانێ کە
«بەهاری کورد هەر ئاڵە
چ بە خوێن بێ چ بە گوڵاڵە<٢>»

* * * *

یادت بەخێر ئەی نیشتمان!
یادت بەخێر ئەی دەسگیران!
یادت بەخێر ماڵی باوان!

یادی بەخێر ئەو کانییەی
هەر یادەکەی تینووم دەکا.
یادی بەخێر ئەو چیایەی
کە تاسەی چوونە سەر دوندی
پێی زیندەم وێندەخا.

یادی بەخێر...

کەنەدا، بەهاری ١٩٨٩-١٣٦٨

<١> لە فۆلکلۆر وەرگیراوە.
<٢>لە شیعرێکی هێمن وەرگیراوە.

# چــزەی پشکۆ

ئەو دەمەی کە
هاوارمان، باڵای
بە باڵای سەرکەوتن دەگرت،
دەستمان
بسەردەمی یەکتر داگرت...

ئەو دەمەی کە
هاوارمان
ناڵەی برینداریکی تینوو بوو،
بە لزکە، قوم قوم ئاومان
بە دەمی یەکتردا کرد...

وەی داخەکەم!
قەت
بۆ ئەوە یەکمان نەگرت
گرتن بگرین.
یەکگرتنمان
لە ترسی گرتنمان،
چەند مەزلوومانە دەنوێنێ...

تۆرنتۆ- کەنەدا ١/٤/١٩٨٩-١٣٦٨

# زووخـــاو

کوت کوت بوونی لافاو
لە ناڕێکی هەردە و
هێندە ئاخ و داخ ناهێنێ؛

نەگەیشتنەوەی
هەموو ئەو ئاوانە
بە دەریایەک، دەردە و
زووخاوان هەڵدێنێ.

تۆرنتۆ ،١٨/٤/١٩٨٩-١٣٦٨

# یاد و ڕیشە

بەیادت، خۆ
ڕێگەی دووریمان کورت نابێتەوە.
بێتوو ڕۆژێک
بۆ خۆشت بێی
خۆ ئەو هەموو ڕەگ و ڕیشە
لە خاکێکی ئاوا بەهێز
نابڕێتەوە؛
بیست و حەوت ساڵ بیرەوەریم
لە بیر ناچێتەوە؛
سرتە و چرپە شیرینەکەت
جێگەی بروام ناگرێتەوە.

بە یادت، خۆ
لەشت
لە نێو نوێنی تامەزرۆمدا
لە تەک لەشم ناتلێتەوە؛
بەڵام
یادت نەکەم چبکەم؟

بێ یادت خۆ
شەوی دووریم نابڕێتەوە
نابڕێتەوە.

کەنەدا ـ ئاگوستی ١٩٨٩-١٣٦٨



# شـــەخـتـە

لابایەک بووی
سەودای شەماڵ بوون ـ ت
لەسەر دا بوو.
بەڵام
گەلاوێژ پێشکەت بوو
نەبڕایەوە
لەو شەختەی کە
بە ساوایی دەمارەکانتی ئەستوور کرد.

پێیان گوتی
هاواریان کرد:
بەفر و شەماڵ دەگەڵ یەک هەڵناکەن.
گوێت ئاخنی و
کردتە پەرژینی خۆت و لێڕەوار
پەڕەی ئاڵی ئەو گوڵاڵەی
لە خاکەڵێوەدا هەڵیانواسی.
بەڕووی شێت بۆ بەهار
شنەی خۆی دەناسێ

لە ئاڵۆزی ڕێگاکانی ئەم دارستانەیە
چوونت بە چەشنی هاتنت
لە ڕەمز و ڕازان ژاوەی دێ.

ئینستراتفورد ١٩٨٩-١٣٦٨



# نێوەڕۆک